4

# تەفسیری نامی

## بۆ قورئانی پیرۆز


دانراوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

ئامادەکردنی: موحەممەد عەلی قەرەداغی

سەرپەرشتی چاپی نوێ: ڕەئووف مەحموودی

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | مدرس، عبدالکریم، ۱۹۰۵ - ۲۰۰۵م. Mudarris, Abd al - karim |
| عنوان و نام پدیدآور | : | دەقی تەفسیری نامی/دانراوی عبدالکریمی مودەرریس. |
| مشخصات نشر | : | سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸۹. |
| مشخصات ظاهری | : | ۶ ج. |
| شابک | : | دوره: 9649800363؛ ج.۱: 9649800370؛ ج.۲: 9649800387؛ ج.۳: 9649800394؛ ج.۴: 9649800400؛ ج.۵: 9649800417؛ ج.۶: 9649800424؛ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| عنوان دیگر | : | تەفسیری نامی بوقورئانی پیروز. |
| موضوع | : | تفاسیر اهل سنت -- قرن ۱۴ق. |
| رده بندی کنگره | : | BP۹۸/م۳۸ت۹ ۱۳۸۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۱۷۹/۲۹۷ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۲۵۶۱۱۱ |

# تەفسیری نامی

## بۆ قورئانی پیرۆز

نووسینی:

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

بەرگی چوارەم

(یووسف، رەعد، ئیبراهیم، حیجر، نەحل، ئیسرا،
کەهف، مەریەم، "طه"، ئەنبیا، حەج و "مؤمنون")



بڵاوکردنەوەی کوردستان
سنە



انتشارات کردستان
Kurdistan Publication

سنە - پاساژی عیززەتی - تەلەفوون - ۲۲۶۵۳۸۲

## تەفسیری نامی

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | تەفسیری نامی (بەرگی چوارەم) |
| ✓ دانراوی (تألیف): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول): ۱۳۸۹ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۳۰۰۰ دەورەی شەش بەرگی (دورەی شش جلدی) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۵۹۲ صفحەی وزیری (شش جلد ۳۳٦۰ صحفه) |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی دەورەی شەش بەرگی: ٦۲,۰۰۰ تمەنە

شابک دورە: ۳ - ۰۳٦ - ۹۸۰ - ۹٦٤ - ۹۷۸
شابک ج ٤: ۰ - ۰٤۰ - ۹۸۰ - ۹٦٤ - ۹۷۸

**سووره‌تی یووسف، مه‌ککه‌ییه‌، ئایه‌ته‌کانی "١" و "٢" و "٣" و "٧" نه‌بێ، ئه‌وان مه‌دینه‌یین، "١١١" ئایه‌ته‌.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓرۚ﴾

خودا عالمه به مه‌عنای.

﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ١﴾

ئه‌م سووره‌ته که نازڵ بووه بۆ سه‌ر تۆ ئایاتی کتێبێکن که رووناك و دیاری و ئاشکران.

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٢﴾

به راستی ئێمه ئه‌م کتێبه رووناکه‌مان نازڵ کردووه‌، به ئیعتیباری بازێکی و، باقیه‌که‌یشی به مۆڵه‌ت ره‌وانه ئه‌که‌ین که حاڵی وه‌هایه قورئانێکه به زمانی عه‌ره‌بی، به هیوای ئه‌وه که ئێوه تێبگه‌ن و به دڵ فامی مه‌عناکه‌ی بکه‌ن و بیکه‌ن به ده‌ستوور بۆ بیر و باوه‌ڕ و کرده‌وه‌ی خۆتان.

﴿نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ
وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ٣﴾

ئێمه ئەگێڕینەوه بۆ تۆ بە گێڕانەوەیەکی زۆر باش باسی شتێکی وا و ڕووداوێکی وەها کە دەلالەت بکا لەسەر ئەوە کە هەمیشە لە دنیادا بازێ کەس حەسوودی ئەبەن بە بازەکەسێ و ئەیانەوێ زیان بدەن لە گیان و ماڵیان، بەڵام خودا خواستی لەسەر پاراستنی هەرکەسێ ببێ ئەیپارێزێ و زیان بەو کەسە ناگا، وە خودا بیەوێ هەرکەسێ گەورە بکا گەورەی ئەکا و کەس ناتوانێ مەنعی خودا بکا لە خواستی ئەو، وە پیاوی بەناموس ئەو کەسەیە هەمیشە ناموسی خۆی و ناموسی خەڵك بپارێزێ و بە ئارەزووبازی ئابڕووی خۆی و خانەدان و خزم خوێشان و مەسلەك نەبا، وە ئەگەر لە ڕێگەی ژیانا کەسانێ زیانیان پێگەیاند و هەلی بۆ هەڵکەوت تۆڵە بسێنێتەوە لێیان، لە باتی ئەو تۆڵەسەندنە عەفویان بکا و چاوپۆشییان لێ بکا، وە ئینسان لە ڕێگەی خزمەتی داماوانەوە و لە چاودێری ئوممەتەوە لە کاتی نەهاتا بەرز ئەبێتەوە و ئەگا بە پایە، وە ئینسان هەرچەن پایەی بەرز بێ ئەبێ حورمەتی باوك و دایك و برای وەکوو حورمەتی عامەی بە حورمەتان ڕاگیر بکا، وە لە پاش ئەوە کە ئینسان بە پایە گەیشت بە خۆی بایی نەبێ و لە خودا یاخی نەبێ و حوقووقی بەندەیی خودا بەجێ‌بێنێ، وە کاتێ گەیشتە تەمەنی هاتنی ئاکام، هەمیشە داوای عەفو و عاقیبەت خێری بکا لە خودای میهرەبان.

وە ئەو گێڕانەوەیشە بە وەحی‌کردن و ڕەوانەکردنی ئەم قورئانە پیرۆزەیە بۆ لای تۆ هەرچەن کە تۆ لە پێش ناردنی ئەم قورئانەدا ئاگادار نەبووی بەسەر ئەو ڕووداوانەدا؛ چونکی نە خۆت خوێندووتە لە زانستگادا و نە خوێندەواری دیاریش لە وڵاتەکەتا بوون هەتا بە شێوەی دەرس‌دادانی گشتی ئەم باسانە بە شێوەیەکی ڕاست بگێڕنەوە بۆتان، وە هەر وەزعی وڵاتەکەت دەلیلە لەسەر ئەوە کە تۆ پێغەمبەری خودای و خودا ئەم دەرسانەت بۆ ڕەوانە ئەکا.

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾﴾

باسی ئەوە بکە کە یووسف کوڕی یەعقووب، کوڕی ئیسحاق، کوڕی ئیبراهیمی باپیرەگەورەی خۆت عەرزی یەعقووبی باوکی کرد: بابە بە راستی من لە خەودا چاوم کەوت بە یازدە ئەستێرە و رۆژ و مانگ هەموو ئەمانە لە ئاسمانەوە هاتنەخوارەوە بۆ عەرز و سەری حورمەتیان بۆ من دانەواند.

﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًا إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾﴾

حەزرەتی یەعقووب عليه السلام لە تەعبیری ئەم خەوەدا وا هاتە بەر زەینی کە یووسف ئەبێ بە پیاوێکی خاوەن پایە لە جیهانا و شتی وای بۆ رێك ئەکەوێ کە عادەت نییە. جا لە ترسی ئەوە کە براکانی لە تەعبیری ئەم خەوە حاڵی ببن و داوێکی بۆ بنێنەوە فەرمووی: کوڕە بچکۆلە خۆشەویستەکەم، ئەم خەوەی دیوتە مەیگێڕەوە بۆ براکانت نەکا حیلە و فێڵێکت لێ بکەن، بە راستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئینسان و لە رێگەی حەسوودییەوە گەلێ زاڵ ئەبێ بەسەریا.

﴿وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾﴾

واتە: وەکوو خودا تۆی هەڵبژارد بۆ ئەو خەوە جوانە وەهایش هەڵت ئەبژێرێ و ئەتکا بە زانای مەعنا و مەفاهیمی ئەحادیس و موشکیلاتی کتێبە ئاسمانییەکان و

رووداوەکانی دنیا و ئەمسالی ئەهلی حیکمەت و ئەسراری ئەهلی ماریفەت و لایەقت ئەکا بۆ ئیدارەی ئومووری ئوممەت، وە خودا نیعمەتی خۆی تەواو ئەکا بە دانی خەڵاتی نوبووەت و ریسالەت و بەرزی لەسەر تۆ و لەسەر ئالی یەعقووب و نەتەوەی ئەو، وەکوو ئەو نیعمەتەی تەواو کرد لەسەر باپیرەکانت لەمەوپێش: ئیسحاق و، ئیبراهیم، بە راستی خودای تۆ زانایە بەوە لە چ زاتێکدا ئەم سیفاتە بەرزانە دائەنێ و، خاوەن حیکمەتە لە کەرەم و بەخششی خۆیا و ئەتوانێ هەموو نیعمەتێ بدا بە هەرکەسێ خواستی ببێ.

ریوایەت کراوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه لە حەزرەتەوە کە فەرموویەتی: «الكريم ابن الكريم ابن الكريم يوسف بن يعقوب بن اسحاق بن إبراهيم»، رواه البخاري و الترمذي.

ئەبووهورەیرە رضي الله عنه فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ: کام ئادەمیزاد گەورەترە؟ ئەویش فەرمووی: گەورەتریان لای خودا ئەوەیە زۆرتر لە خودا بترسێ. عەرزیان کرد: مەبەستمان ئەوە نییە. فەرمووی: دەی گەورەتریان (واتە بە رشتەی نەسەب) یووسفە کە پێغەمبەری خودایە کوڕی پێغەمبەری خودا کوڕی پێغەمبەری خودا کوڕی پێغەمبەری خودایە کوڕی دۆستی خودایە. وتیان: لەمەیش ناپرسین. فەرمووی: یانی لە ئەسڵ و کانی عەرەب پرسیار ئەکەن؟ عەرزیان کرد: بەڵێ، فەرمووی: دەی هەر قەومێ کە لە زەمانی پێش ئیسلامییەتا باش بووبن ئەوانە لە عەهدی ئیسلامییەتیشا باشن بە مەرجێ ئاگادار بن لە دەرسی دیندا و رەفتاری پێ بکەن.

ئەم فەرموودەی حەزرەتە زۆر بەرز و بە نرخە.

یەکەم: شەرافەتی کرد بە ترسان لە خودا.

دووەم: شەرافەتی کرد بەوە چەن پشتی لەسەر یەك خاوەن پایە بن لە لای خودا.

سێهەم: شەرافەتی کرد بە ئیعتیبار و قیمەتی ناو کۆمەڵی ئادەمیزاد بە مەرجێ کە خاوەنی زانست و زانیاری و کردەوەی موسوڵمانانە بن.

لەم فەرموودەوە دەرئەکەوێ هەر ئادەمیزادێ زانابێ و رەفتار بکا بەو زانستی خۆیە ئەوە لە چەرخی خۆیا بۆ ئەوە ئەشێ بە ئینسانی بە نرخ حسێب بکرێ کوڕی هەرکەسێ ببێ.

﴿لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ۝٧﴾

بە راستی هەیە و بووە لە یووسفدا و لە رەفتاری براکانی لەگەڵ ئەودا چەن دەلیلێکی گەورەی بە نرخ بۆ ئەو کەسانە پرسیار ئەکەن لەم باسە.

واتە لە رووداوی بەینی ئەوانا ئەوەندە شتی وردی تێدا هەیە هەرکەسێ لەم باسە بپرسێ و جوابەکەی وەربگرێ گەلێ ئیستیفادە ئەکا بۆ دین و بۆ دنیا و بۆ حاڵی نەفسی خۆی و بۆ حاڵی لەگەڵ غەیری خۆیدا، خواه ئەو غەیرە بازە کەسێکی کەم بن یاخود ئوممەتێ بن.

**لێرەدا چەن باسێ هەیە:**

یەکەم: یووسف کوڕێکی خاوەن بارە بووە لە سوورەت و سیرەتا و ئینسانی وەها حەسوودی پێ ئەبرێ حەتا لە لایەنی برا و کەسی خۆیەوە و پێویستە ئەو کەسە هۆشیار بێ و ئاگای لە خۆی بێ.

دووهەم: یووسف گیرۆدە بوو خۆی گرت لەو مەینەتەدا، وە هەرکەسێ کاتێ گیرۆدە بوو پێویستە خۆگر بێ و خۆی تەسلیمی قەزا و قەدر بکا.

سێهەم: زۆر جوان بوو، وە هەرکەسێ وابێ گیرۆدەی عەشق و مەحەبەتی خەڵك ئەبێ؛ جا لەو کاتەدا پێویستە هەتا هێزی تیایە بە ناموس بێ و ئەو نیعمەتی جوانییە خودا پێیدا لە شتی بێناموسیدا زایەی نەکا.

**چوارەم:** پێویستە وەکوو یووسف خەیانەتی لە خانەدانی خاوەن حوقووقی نەکرد هەرکەسێ کە حەقی لەسەر ئینسان بوو وەفا بە حەقی ئەو کەسە بکا.

**پێنجەم:** کاتێ ئینسان کەوتە بەینی دوو شتی نابارەوە یەکێکیان ناباری دینی بێ و ئەویان ناباری دنیایی بێ، ئینسان نابارە دنیاییەکە هەڵبژێرێ بۆ ئەوە لە نابارە دینییەکە رزگار ببێ.

**شەشەم:** ئینسان هەلی خۆی لە دەست دەرنەکا، وەکوو یووسف کە مەجالی دەست کەوت لە لای پاشای «میسر» خۆی پێ نیشان دا و تێیگەیاند کاری گەورەی پێ ئەکرێ هەتا ئەویش کردی بە وەزیر و میسری لە بەردەستیا دانا.

**حەوتەم:** باوەڕکردنە بەوە خودا بیەوێ هەرکەسێ بپارێزێ ئەیپارێزێ، وە هەرکەسێ گەورە بکا گەورەی ئەکا.

﴿ إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ﴾

درێژەی ئەم باسە ئەمەیە: کە حەزرەتی یەعقووب کوڕی حەزرەتی ئیسحاق عليهما السلام پوورزایەکی خۆی (یانی کچی خوشکی دایکی) مارە کرد ناوی «ليا» بوو لەم ژنە حەوت کوڕی بوو «یەهوودا و، روبیل و، شەمعون و، لاوی و، ربالون و، یشجر و، دینە» و دو جارییەیشی بوو ناویان «زلفة» و «بلهة» بوو لەم دوانەیش چوار کوڕی بوو: «دان و نفتالی و، جاد و، آشر» وە لە پاش مردنی «ليا»، «راحيل»ی خوشکی لیای مارە کرد، لەم ژنەیش «یووسف و بنیامین»ی بوو، وە ئەو کوڕە گەورانە مەشغووڵی خزمەتی ئەو خانەدانە بوون و لەسەر وەزعی رۆژ ئیدارەیان کرد.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە یووسف کوڕێکی زۆر شیرین بوو نیشانەی هەڵکەوتن لە ناوچاویا دیار بوو بە تەمەنیش منداڵ بوو هەروا بنیامینی برایشی، حەزرەتی

یەعقووب زۆر مەیلی دڵی لەلای ئەم دوانە بوو بە تایبەتی لەلای یووسف. وە لەم لایشەوە ئەم دوو منداڵە دایکیان مابوو وە لە خانەدانەکەدا زۆرتر خزمەتیان ئەکرا.

جا کوڕە گەورەکان دڵیان گەردی گرت و وتیان: مەعنای نییە ئێمە ئەم هەموو باری زەحمەتە وا بەسەر شانمانەوە کەچی باوکمان بەمجۆرە ڕەفتار ئەکا لەگەڵ یووسف و براکەیا و موبالات بە ئێمە ناکا و هەمووومان ئەولادی ئەوین! بە ڕاستی باوکمان لە بابەتی تەماشاکردنی کۆمەڵایەتی خانەدانەوە ڕێگەی ڕاستی ون کردووە، وەکوو خودا ئەو ئایەتەی نازڵ کردووە ئەفەرموێت: براکانی یووسف وتیان: بە ڕاستی یووسف و بنیامینی برای خۆشەویستترن لە لای باوکمان لە ئێمە وەلحاڵ ئێمە کۆمەڵێکین و خزمەتی ئەو و ئەم خانەدانە ئەکەین، بە ڕاستی باوکمان لەم ڕووەوە ڕێگە نازانێ!

﴿ اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ ﴿٩﴾ ﴾

لە بەینی خۆیانا وتیان: بنیامین زۆر منداڵە و شێوەیشی وەکوو یووسف نییە و ئێستە یووسف تەماشاکردنی باوکمانی ڕاکێشاوە، بێن یووسف بکوژن یاخود فڕەی بدەن بۆ شوێنێکی وا نەگەڕێتەوە بۆ لای باوکم. با ڕووی باوکتان هەر بۆ ئێوە بمێنێتەوە، پاش ئەوە تەوبە بکەن و مەشغووڵی سەلاحەت و عیبادەت بن و ئیشی دنیای خۆتان ڕێك بخەن و خزمەتی باوکیشتان بکەن، ئەویش ڕێك ئەکەوێ لەگەڵتانا و، ئەم بیرە بیری شەمعون بووە و باقی براکانی پێی ڕازی بوون.

﴿ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾

وە خاوەن راییِ‌تریان وتی: بابە یووسف مەکوژن، کوشتن تاوانێکی گەورەیە، بەڵام بیهاوێنە ناو بێخی بیرێ، لە لایەکەوە دیار نەبێ و نەیشخنکێ، هەتا بازێ لەوانە کاروان ئەکەن و ئەڕۆنە سەر ئەو بیرە ئاو هەڵئەگۆزن بە دۆڵچە و بە یووسف ئەزانن و لە بیرەکەی دەردێنن، ئەگەر ئەتانەوێ ئیشێکی وا بکەن جیای بکەنەوە لە باوکی، وە خاوەنی ئەم بیرە براگەورەکەیان بوو کە ناوی «یەهوودا» بوو، وە هەموو براکان لەسەر ئەم بیرە دڵیان دامەزرا، جا کەوتنە هاتوچۆ بۆ ئەوە کە ئیزن لە باوکیان وەربگرن و یووسف ببەن بۆ سارا و لەوێ ونی بکەن.

﴿قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿١٢﴾﴾

جا رۆیشتن بۆ لای حەزرەتی یەعقووب عليه السلام و عەرزیان کرد: نازانین چیت لێ بووە بە مانیع کە تۆ ئێمە بە ئەمین نازانی لەسەر یووسف وەلحاڵ ئێمە هەموو خزمەتی ئەکەین و خێرخواهی ئەوین؟ جا ئەگەر بە ئەمینمان دائەنێی سبەینێ لەگەڵ ئێمەدا ئیزنی بدە بێت بۆ سەیران، لە خوارەدەمەنی دەشت ئەخوا، وە یا لەو شتە خۆشانە کە بە ئێمەیە ئەخوا و بۆ خۆی گاڵتە و یاری ئەکا و بە راستی ئێمە بۆ ئەو نیگابانین و ئەیپارێزین لە هەموو ئازار و بێزار و دڕندە و حەیوانی کۆسار.

﴿قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ أَن تَذْهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَـٰفِلُونَ ﴿١٣﴾﴾

حەزرەتی یەعقووب هەرچەن بە دەلیل و نیشانەدا ئەیزانی کە ئەوان بیریان باش نییە لەگەڵ یووسفدا بەڵام ئەوەی نەدا لە روویان و بیانووی بە دوو شت هێنایەوە؛ یەکەم: فەرمووی: بەمە کە یووسف بەرن و لە بەرچاوم ون ببێ و ببیەن بۆ دەرەوە دڵم تەنگ ئەبێ، چونکی ئولفەتم پێوە گرتووە و کاتێ لەبەرچاوم نەبێ دڵم دائەگیرێ.

دووەم: ئێوە گەنجن و لە دەشتا خەریك ئەبن بە گاڵتە و یاریکردن و ئەترسم لە چاودێری یووسف غافڵ ببن و دەشتی کەنعان گورگی زۆرە و گورگێ لەوانە بێت هەڵی بگرێ و بیخوات.

﴿قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ﴿١٤﴾﴾

ئەوانیش وتیان: کاری وا چۆن ئەبێ؟ وەڵڵاهی ئەگەر گورگ بێت یووسف بخوا و ئێمە کۆمەڵێکین و لەم کۆمەڵەدا کەس چاودێری نەکا هەتا گورگ هەڵی بگرێ وە یاخود بە رفاندن بیرفێنێ و ئێمە چارمان پێ نەکرێ، ئێمە مادام وابێ کۆمەڵێکی زیانکاری بێنرخ و بێئیعتیبارین! حاشا ! لەم خەیاڵانە دوور بکەوەرەوە و ئیزنی بدە بێ بۆ سەیران.

﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَـٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ
لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَـٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾﴾

واتە حەزرەتی یەعقووب لە بەینی دڵخواز و نەبەدڵێدا ئیزنی دان یووسف ببەن بۆ سەیران و، کاتێ کە بردیان بۆ دەشتی کەنعان و هەموویان بڕیاریان دا کە بیهاونە ناو بیرەکەوە گەلێ بێڕەحمی و دڵڕەقییان کرد لەگەڵیا، واتە هەرچەن لێیان پاڕایەوە سوودی نەبوو، کراسەکەیان لەبەر دارنی و دایانهێشتە ناو بیرەکەوە، وە لەو کاتەدا کە ئەو لە مردن رزگار بوو، وە لە ناو بیرەکەدا لە گۆشەیەکەوە کزی کردبوو ئێمە بۆ دڵخۆشی دانەوەی یووسف ئیلهامی دڵی ئەومان کرد و تێمان گەیاند: کە تۆ لەم بیرە دەرئەچی و رۆژێ ئەبێ ئەم برا ناپیاوانەت گرد ئەبنەوە لە لای تۆدا و تۆ خەبەریان پێ ئەدەی بەم کارە نابارە کە ئەوان لەگەڵ تۆدا کردیان و ئەوان نازانن کە تۆ یووسفی برای ئەوانی.

وە پاش ئەوە ئەو برایانە لە دەوری بیرکە دوورکەوتنەوە حەیوانێکیان سەربڕی بۆ خۆیان کردیان بە بوریانی و بە خوێنی ئەو حەیوانە کراسەکەی یووسفیان سوور کرد.

﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ١٦﴾

وە لە کاتی عیشادا هاتنەوە لای یەعقووبی باوکیان بە کوڵ ئەگریان.

﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ﴾

وتیان: بابە بە ڕاستی ئێمە کاتێ گەیشتین بە سارا ڕۆیشتین بۆ موسابەقە و ڕاکردن بە مەیدانا بزانین کام لە ئێمە زۆر توند ڕائەکا و پێش ئەکەوێ و یووسفمان بەجێ هێشت بە لای بەرگ و پۆشاکەکەمانەوە و لەو کاتەدا گورگ خواردی.

﴿وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧﴾

وە تۆ لەوانە نیت کە باوەڕمان پێ بکەیت هەرچەن ئێمە ڕاستگۆ بین.

﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ﴾

وە بە خوێنێکی درۆینە کراسەکەیان خوێناوی کرد و هێنایان بۆ لای باوکیان، ئەویش تەماشای کراسەکەی کرد خوێناوی بوو بەڵام ئاساری دان و چنگی گورگی پێوە نەبوو، لەوێدا باش حاڵی بوو کە یووسف گورگ نەیخواردووە.

﴿قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ﴾

فەرمووی: یووسف گورگ نەیخواردووە بەڵکوو نەفسی خۆتان شتێکی وای بۆ سازاندوون کە بیکەن و پیشانی منی بدەن.

﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾

وە بەش و بارەی من سەبرێکی جوانی وایە کە موناسبی خانەدانی رەهبەران بێ، واتە دەس نەکەین بە هاوارکردن و لە خۆ دان، وە هاوار نەبەم بۆ گەورەیێ لە ولاتەکەدا بێت بتانگرێ و سزاتان بدا هەتا ئەوەی کردووتانە دەربکەوێ، وە لەگەڵ خەڵکیشا نەڕۆم بۆ کێومالٚ تا بزانم لە کوێدا کوژراوە یا گورگ خواردوویەتی یا خراوەتە چاڵێکەوە.

﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨﴾

هەر خودایە داوای یارمەتی لێ ئەکرێ بۆ ئەوە تەوانایی بدا بە دڵی من لەسەر هەڵگرتنی ئەم بارە گرانە کە ئێوە باسی ئەکەن.

بزانن! ئەوەی کە مەعلوومە لە دینا ئەمەیە سەبرکردن لەسەر مسیبەت لەگیانا یا لە دارایی‌دا یا لە شان و پایەدا یا لە ناساغیدا سیفەتێکی گەورەیە و لە سیفاتی پێغەمبەران و رەهبەرە گەورەکانە. وە مەعنای سەبرێ کە واجبە لەسەر موسوڵمان ئەمە نییە کە ئێش نەگا بە دڵی، یا نەگریێت، تەماشا ئەکەین حەزرەت ﷺ لەسەر ئیبراهیمی کوڕی کە وەفاتی کرد گریا و فەرمووی: ئێمە لەسەر مردنی تۆ غەمبار و زویرین، بەڵکوو مەعنای سەبری شەرعی دوو شتە:

یەکەم: ئینسان وا بزانێ ئەم مسیبەتە خودا ناردوویەتی و خودا فەرمانڕەوای عامە و واجبی ئێمە ئەوەیە لەم رووداوەدا ئیعتیرازمان نەبێ لەسەری کە بۆچی وەهات کرد؛ چونکە خاوەن حیکمەتی موتڵەق جێگەی ئیعتیراز نییە.

دووهەم: ئەو ئینسانە کە گیرۆدە بووە کارێ نەکا بە هاوارکردن، وە یا گلەیی‌کردن، وە یا هاتوچۆ بۆ لای خەڵکی کە نیسبەت بە پایەی ئەو کەسە موناسب نەبێ. کە وابێ مەعنای «سەبری جەمیل» خۆ گرتنێکە لە پاش ئیعتیراز نەگرتن لە خودا هاوار

و تەقالا و دەنگ و باسی تێدا نەبێ، وە «سەبری غەیرە جەمیل» ئەوەیە کە ئینسان دەست بکا بەو هاوار و هاتوچۆیە؛ بۆیە حەزرەتی یەعقووب ئەڵێ: باسی دڵزویری خۆم هەر لە لای خودا ئەکەم.

وە بیشزانین مەعنای سەبر ئەوە نییە کە ئینسان مادام بتوانێ چاری دەردی خۆی بکا نەکەوێتە شوێن چاری دەرد، بەڵکوو دروستە بۆ ئینسان هەر دەردێ و هەر بەلاّیێ کە دینی بێ یا دنیایی بێ و لە ئیمکاندا ببێ چارکردنی حەول بدا بە پەنابردن بۆ لای خاوەن دەستەلاّت، وە یا بە دەرمانکردن، وە یا سەرفی ماڵ ئەو مسیبەتە چار بکا، جا کە هەر چار نەکرا دەرئەکەوێ کە قەزای خودا سادر بووە و تەسلیم ببێ و بڵێ: ﴿إنا لله و إنا إليه راجعون﴾.[1]

هەروا بزانن، ئەم برایانی یووسفە کە ئەم کارە ناهەموارەیان کردووە لەگەڵیا هیچ کام لەوان نەبووە بە پێغەمبەر و وەحی بۆ نەهاتووە لە لای خوداوە؛ چونکە ئەسەح ئەمەیە پێغەمبەران لە پاش خەلاّتی پێغەمبەرایەتی و لە پێش ئەوەیشا ئەبێ مەعسووم بن لە گوناحی گەورە و ئەم گوناحە کە ئەوان کردیان بوویە چەن گوناح، وەکوو قەسدی ئیهلاکی یووسف؛ چونکی غاڵبی گومانیان وابوو کە ئەمرێ و دەرهێنانی کاروانی قەتعی نەبوو. وە لەم لایشەوە دڵی باوکیان بەو جۆرە نابارە ئازاردا و چەن درۆ و دەلەسە و سوێندی درۆ لەم کارەساتەدا هاتە سەریان.

﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٩﴾

---

١. البقرة: ١٥٦.

ریوایەت کراوە پاش سێ ڕۆژ لەو ڕووداوە کاروانێ لە شاری «مەدیەن»ەوە ڕووی کردە «میسر» و لە ڕێگەدا لە نزیکی ئەو بیرەدا باریان خست و ئاسایشیان کرد و لەسەر یاسای کاروانی پیاوێ ناوی مالیکی کوڕی زعری خەزاعی بوو ناردیان ئاویان لەو بیرە بۆ هەڵێنجێ، ئەویش کاتێ دۆڵچەکەی داهێشتە خوارەوە حەزرەتی یووسف ڕۆیشتە ناو دۆڵچەکەوە کاتێ هەڵیان کێشا تەماشایان کرد کوڕێکی جوانی تێدایە! ئەویش زۆر شادمان بوو وتی بە هاوڕێکانی: موژدە بێ ئەمە کوڕێکی جوانە لە ناو دۆڵچەکەدا هاتەسەرەوە، جا لە ناو خۆیانا وەکوو کەلوپەلی بازرگانی شاردیانەوە بۆ ئەوە کەس پێیان نەزانێ، وە خودایش زانایە و زانا بوو بە کارەکەیان و حەزی کرد بەوە کە دەستی ئەوانە بکەوێ بۆ ئەوە کە بیبەن بۆ میسر و بکەوێتە خانەدانی وەزیرەوە.

﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ  ﴾

وە ئەو کەسانە کە یووسفیان دەرهێنا لە بیرەکە کاتێ گەیشتنە میسر یووسفیان فرۆشت ـ لەسەر حسێبی ئەوە کە بەندەی ماڵی تیجارەتە ـ بە وەکیلی مەسرەفی وەزیری میسر بە پارەیەکی کەم کە عیبارەت بوو لە چەن درەمێ و ئەوانە لە بابەتی موعامەلەی یووسفەوە لەوانە بوون کە ماڵی دنیایان نەوێ هەرئەوەیان ئەویست کە بیفرۆشن و لە لایان نەمێنێ لە ترسی ئەوە نەکا خاوەنی ئەو غولامە بکەوێتە شوێن کاروانەکە و دەربکەوێ ئەو کوڕە دۆزراوەتەوە و ماڵی تیجارەت نییە.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ﴾

وە ئەو وەزیرە کە یووسفی کڕی لە میسرا وتی بە ژنەکەی: خزمەتی ئەم غولامە بکەن و باش بەخێوی بکەن، هیوام وایە کە قازانجمان پێ بدا لە خزمەتکردنی دیوان و مالاّ وە یا لە کلیل بە دەستی مەسرەفدا، یاخود هەر بیکەین بە کوڕی خۆمان مادام ئەدەب و ئەخلاقی بەرزمان چاو پێکەوت لە ڕەفتاریەوە.

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ ۚ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾﴾

وە هەر وەکوو چۆن یووسفمان لە بیرەکە ڕزگار کرد و لە میسرا فرۆشتمان بە وەزیری پاشا هەروا خاوەن دەستمان کرد لە عەرزی مولّکی وەزیرا، وە یا لە عەرزی ولاّتی میسرا، وە تا بمێنێتەوە بەسەر بەرزی لەوێدا، وە تا تەعلیمی مەعانی کتێبە ئاسمانییەکانی بکەین تا گەورەیی میسری پێ بکرێ، وە خودا زالّە بەسەر خواستی خۆیا بەلاّم زۆربەی ئادەمیزاد نازانن بەم حالّە.

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾﴾

جا پاش ئەوە کە یووسف گەیشتە ئەوپەڕ پایەی هێزی وجوودیەوە کە مابەینی (٣٠) سالّە تا (٤٠) سالّ، حیکمەتی عەمەلی و ڕەفتاری پیاوانەی عادلاّنە و عیلم و زانستی واجباتی تایبەتی خۆی لە هەموو بابەتێکەوە پێمان دا و کردمان بە ئینسانی هەلّبژێراوی زانای تەوانا. وە هەر بەم جۆرەیش جەزای ئەو کەسانە ئەدەینەوە کە خاوەن ئیحسانن و بیر و باوەڕ و کردەوە و ڕەوشتیان باشە.

بزانن! بازێ لە موفەسیرەکان فەرموویانە: سەرەتای پێغەمبەرایەتی حەزرەتی یووسف لەو کاتەوە بووە کە کەوتە ناو بیرەکەوە و خودا پێی فەرموو: «لەمەولا ئاگادارت ئەکەم لە حالّی براکانت و ئەوان بە تۆ نازانن».

وە بازێ فەرموویانە: سەرەتای پێغەمبەرایەتی ئەو لەو کاتەوە بووە کە خرایە زیندانەوە. وە بازێ فەرموویانە: پاش ئەوە کە یووسف بوو بە ئەمینداری پاشای میسر و دەستی کرد بە خزمەت کردنی میللەتی میسر، وە خودای تەعالا خۆی عالمە بە حەقیقەتی حاڵ. بەڵام ئەم بیرە دواییە زۆر پەسەندە؛ چونکی ئەگەر حەزرەتی یووسف لە عومری چواردە و پازدەدا گەیشتبێ بە میسر و کەوتبێتە ماڵی عەزیزی میسرەوە چەن ساڵێ لە ماڵی ئەوا بووە و پاش ئەوە کە خراوەتە سیجنەوە حەوت ساڵ لە حەپسخانەدا بووە و پاش ئەوە لە حەپسخانە هاتووەتە دەرەوە بووە بە کار بەدەستی دارایی پاشای میسر یاڵڵا بووە بە ئینسانێکی رەسای موناسب بۆ پایەی رەهبەری و لەوەولا خودا کردوویەتی بە رەهبەر و دەعوەتی خەڵکی کردووە بۆ دینی تەوحید و بۆ شەریعەتی باوك و باپیرەکانی هەتا ئیبراهیم عليه السلام.

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ﴾

زۆر هاتوچۆی کرد ئەو ژنە کە یووسف لە ماڵی ئەوا بوو، وە تێکۆشا لەگەڵ یووسف بۆ رامکردنی نەفسی یووسف بۆ خۆی؛ چونکی یووسف زۆر جوان بوو وە ئەو ژنەیش زۆر جوان بوو بە دڵ گرفتاری عەشقی یووسف بووبوو، وە ئەوەی کە ئینسان رابکێشێ بۆ ئارەزووبازی ـ لە نیشاندانی شێوەی جوانی خۆی بە بەرگی جوانەوە و کردنە بەری بەرگی جوان و زەڕ و زیوەری نایاب و بە ناز و دەلاڵەوە و قسەکردن لەگەڵیا و خزمەتکردنی و دڵڕاگرتنی ـ بەجێ‌هێنا، هەتا بیری هاتە سەر ئەوە کە هەر چۆن ئەمر بکا بە یووسف ئیتاعەی ئەکا و ملپێچی ناکا. جا لەم کاتەدا فرسەتی لێ هێنا.

﴿وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ﴾

وە زلێخا دەرگای هۆدەکانی لە دەر و ژوورەوە داخست بە جۆرێ کەس پێیان نەزانێ و وتی بە یووسف: فەرموو بێ بۆ لام تا پێکەوە رابوێرین! وە حەزرەتی یووسف لەبەر پاکی نەفسی خۆی موبالاتی پێ نەکرد و عوزری بۆ هێنایەوە بە سێ جۆر.

﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾



یەکەم: فەرمووی: پەنا ئەگرم بەو خودایە کە کردەوەی خراپی حەرام کردووە و پێویستە هەموو کەسێ خۆی لە حەرام لابدا بە تایبەتی یەکێ کە لە خانەدانی دین و زانیاری دین بێ.

دووهەم: فەرمووی: ئەو کەسە کە خاوەنی عیسمەتی تۆیە گەورە و سەییدی منە و پایەی باش راگرتووم و زۆر دوورە لە حوقووقی وەفا و کەرامەتەوە ئینسان خەیانەت لەگەڵ خانەوادەی گەورەی خۆیا بکا، بە تایبەتی گەورەیەکی وا کە حورمەت و پایەی دابێ بەو کەسە.

سێهەم: خۆ بەرەڵا کردن بۆ ئارەزووبازی و دەستبردن بۆ ناموسی خەڵك موخالیفی عەقڵی سەلیمە، وە ستەمە و تەجاوزە لەسەر یاسای ویژدان و کەرامەتی ئینسانی و بە راستی هەرکەسێ ستەمکار بێ رزگار نابێ.

﴿وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾

بە راستی ژنی وەزیری میسر زلێخا ناو قەسدی لەزەتوەرگرتنی کرد لە یووسف علیه السلام، وە حەزرەتی یووسف بە هۆی ئینسانییەتەوە قەسدی زلێخای نەکرد ئەگەر لەو کاتە تاریکەدا چرای دڵی خۆی لە لایەنی خوداوە بە هەڵکراوی دەرك نەکردایێ، بەڵام لەو

کاتەدا لە ویژدانی خۆیا دەرکی نوور و رووناکی و ئینشیراحێکی رۆحی وەهای کرد لە قەسدکردنی ئەوکارە نابارە دوورکەوتەوە، واتە یووسف قەسدی زلێخای نەکرد؛ چونکی هێزێکی رۆحی خودایی لە دڵیا پەیدا بوو مانیع بوو لەو قەسدە و ئێمە بۆیە ئەو بورهانەمان پێ نیشان دا بۆ ئەوە ئەو کارە ناهەموارەی لێ دوور بخەینەوە؛ چونکی بە راستی بڕیاردراوە کە یووسف لە بەندە خالیسکراوەکان و لە رەهبەرەکانە لە دەفتەری عیلمی ئێمەدا و رەهبەران ئەبێ لە کاری نابار دوور بن.

﴿وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ﴾

جا یووسف و زلێخا هەردوو کەوتنە کێبەرکێ بۆ لای دەرگای ماڵەکە، وە هەرکام لەوان کۆششیان ئەکرد بۆ ئەوە کە لە پێش ئەوا پێی بگەن، یووسف ئەیویست بگا بە دەرگاکە و بیکاتەوە و خۆی رزگار بکا لە دەستی زلێخا و، زلێخا ئەیویست زوو بگا بەو دەرگایە هەتا پشتی پێوە بنێ و نەیەڵێ یووسف دەرچێ و مەقسوودی خۆی بەجێبێنێ وە یا خەڵك بەو کارەساتە نەزانن، وە یووسف کەوتە پێش و زلێخا لە دوایەوە ملەوانی کراسەکەی یووسفی گرت.

﴿وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ﴾

وە کراسەکەی یووسفی لە پشتەوە دادڕی؛ چونکی یووسف بەهێز پەلەی ئەکرد بگات بە دەرگاکە و زلێخا کراسەکەی رائەکێشا و کراسەکە بە دەستیەوە دڕا.

﴿وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ﴾

بە قەزا و قەدەری خودا لەو کاتەدا تەسادوفی مێردەکەی زلێخا واتە «قطفیر» ناو وەزیری پاشای میسریان کرد. وە بە فەوری بۆ پێشدەستی، زلێخا هاواری کرد لە «قطفیر».

﴿قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٥﴾﴾



وتی: جگە لە سیجن و سزای سەخت چی‌تر هەیە ببێ بە تۆڵەی کەسێ کە بیەوێ خەیانەت لە عائیلەی تۆ بکا؟

وە حەزرەتی یووسفیش بۆ چاری کەرامەتی خۆی هاتەدەنگ و،

﴿قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى﴾

فەرمووی: حاشا! من هیچ کارێکی نابارم نەکردووە و ئەو هەوڵی دا بۆ رامکردنی من و منیش ویستم خۆم دەرباز بکەم تا لەم شوێنەدا گەیشتین بە تۆ.

﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾﴾

وە لەوێدا شایەتێك لە خزمی زلێخا شایەتی دا و وتی: تەماشا بکەن ئەگەر کراسەکەی یووسف لە بەرەوە دڕاوە ئەوە زلێخا راست ئەکا و یووسف لە درۆزنانە؛ چونکی ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە یووسف دەستی بردووە بۆ زلێخا و ئەویش مەنعی کردووە و یووسف کراسەکەی دادڕیوە. وە ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕاوە ئەوە زلێخا درۆ ئەکا و یووسف راست ئەکا؛ چونکی ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە زلێخا داوای رووبەڕوویی لە یووسف کردووە و ئەویش پشتی لێ هەڵکردووە و زلێخا لە پشتەوە کراسەکەی گرتووە و ئەویش خۆی راکێشاوە هەتا کراسەکەی لە پشتەوە دڕاوە.

﴿فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ٢٨﴾

جا کاتێ کە قەتفیر تەماشای کرد و دەرکەوت کراسەکەی یووسف لە پشتەوە دڕاوە و باش تێگەیشت یووسف پاکە. وتی: ئەم ڕووداوە لەگەڵ ئەم گریان و شکات و پێشدەستی تۆدا بە عیبارەتی جازیبە بۆ دڵی ئێمە لە حیلەی ژنانەی ئێوەیە و بە ڕاستی حیلەی ئێوە زۆر وردە و تەئسیری گەورە ئەکا وە ئەگەر هۆشیارییێکی باش نەبێ پیاو ئەهاوێتە هەڵەوە.

جا پاش ئەوە کە وەزیر حاڵی بوو لە وەزعی ناو ماڵەکە وتی:

﴿يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ﴾

ئەی یووسف وا ئەزانم تۆ پاکی و باسی ئەم ڕووداوە مەکە با دەنگمان دەرنەچێ.

﴿وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ٢٩﴾ ۞

وە ئەی زلێخا تۆیش داوای چاوپۆشی لە خودا بکە بۆ تاوانی خۆت، بە ڕاستی لە تاوانبارانی لەم کارەساتەدا، وە ئەم جارە بەم جۆرە سەری ئەم ڕووداوەیان نایەوە و باسەکە کپ بووەوە لە ناو ماڵەکەیانا.

**لێرەدا چەن باسێ هەیە:**

یەکەم: لەسەر ئەو تەفسیرە من نووسیم لە لایەنی حەزرەتی یووسفەوە عليه السلام قەسدی کاری خراپ نەبووە لەبەر ئەوە کە جوملەی ﴿وهمّ بها﴾ ئەبێ بە جوابی ﴿لولا﴾ و لێی پێشکەوتووە وەکوو ئیمام فەخری ڕازی بە نەقڵ لە سیبەوەیهییەوە ئەو پێشکەوتنەی ڕەوا داوە. کە وابێ مەعنای ئایەتەکە وایە: ئەگەر یووسف بورهانی

خودای دەرك نەكردایێ قەسدی ئەو كارەی ئەكرد: بەڵام مادام بورهانەكەی دەرك كرد ئەو قەسدەی نەكرد، وە ئەمە مەعلوومە بۆ خوێندەوار.

دووهەم: لەسەر ئەو تەفسیرە من نووسیومە «بورهان»ەكە عیبارەتە لەو نوورە كە لەو كاتەدا خودای تەعالا دایناوە لە دڵی یووسفا خواه نووری عیسمەت بێ كە بۆ پێغەمبەرانە ـ مادام لەو كاتەدا پێغەمبەر بووبێ ـ یاخود تەوفیق و ئیرهاس بێ ـ ئەگەر لەو كاتەدا پێغەمبەر نەبووبێ ـ وە كەلیمەی بورهان زۆر موناسبە بۆ ئەم هێزە مەعنەوییە؛ چونكی بۆ هێزی قەتعی و بڕندە بەكار دێ، وە نووری عیسمەتی پێغەمبەران و نووری تەوفیق هەردوویان زۆر بڕندە و خاوەن تەئسیرن.

سێهەم: ئەو شایەتە كە شایەتی دا بە پاكی یووسف بازێ لە موفەسیرەكان وتوویانە پیاوێ بوو ئامۆزای زلێخا یا خاڵۆزای بوو، وە ئەو ئەم تەدبیرەی كرد بۆ عەزیزی میسر كە تەماشای كراسەكەی یووسف بكا: ئاخۆ لە بەرەوە دڕاوە یا لە دواوە؟

وە زۆربەی موفەسیرەكان فەرموویانە: منداڵێ بوو لە بێشكەدا خزمی زلێخا بوو وە بە شێوەی «خرق العادە» خودا هێنایە وتار بۆ ئەو رووداوە بە دەلیلی فەرموودەی حەزرەت ﷺ كە فەرموویەتی: چوار منداڵ هاتوونەتە وتار: «ماشتە»ی كچی فیرعەون[١]. [وە] شایەتەكەی یووسف وە ئەو منداڵە كە لە زەمانی «جریج»ی راهیبدا هاتە وتار بۆ شایەتی پاكی «جریج» وە عیسای كوڕی مەریەمعليه السلام.

چوارەم: پێویستە بزانن كە حەزرەتی یووسفعليه السلام لەو رووداوی ماڵی وەزیرەدا مەعسووم و پاك بووە لە هەموو جۆرە تاوانێ بە دەلیلی ئەوە (وەكوو ئیمامی رازی فەرموویەتی) هەركەسێ پەیوەندی بووبێ بەو رووداوەوە شایەتی داوە بە پاكی

---

[١. مامۆستا لە تەفسیری «مواهب الرحمن» بەرگی ٤ لاپەڕە ٣٦١ دا ئەفەرموێ: كوڕی ماشتەی كچی فیرعەون، نەك ماشتە خۆی. ـ بڵاوكردنەوەی كوردستان].

یووسف وە ئەوانە کە عەلاقەدارن لەوا یووسف و، زلێخا و، شایەت و، وەزیر و، ژنانی میسری و، خودای تەعالا و، دوژمنی گەورە شەیتان.

١. یووسف علیه السلام فەرموویەتی: ﴿هي راودتني عن نفسي﴾، واتە: زلێخا هاتوچۆی کرد بۆ لای من و ویستی مەیلی بدەمێ و من پەیوەندیم نەبوو، وە فەرموویەتی: ﴿رب السجن أحب إلي مما يدعونني إليه﴾، واتە: خودایا زیندانم پێ خۆشترە لەو تاوانە و لەو کارەی ئەوان منی بۆ بانگ ئەکەن. وە خودا ئەمانەی گێڕاوەتەوە و تەقریری کردوون.

٢. زلێخا لای ژنە میسرییەکان دانی پیانا وتی: ﴿لقد راودته عن نفسه فاستعصم﴾، واتە: بە راستی من هەوڵم دا لەگەڵ یووسفدا و ویستم رامی بکەم، واتە من تەماعم تێکردبوو لەگەڵی خەریك بووم بەڵام ئەو خۆی نەدا بە دەستەوە. هەروا لای پاشای میسریشدا پێی لێناو وتی: ﴿الآن حصحص الحق، أنا راودته عن نفسه، وإنه لمن الصادقين﴾، واتە: ئێستە راستی دەرکەوت، من فرو فێڵم کرد بۆ رامکردنی یووسف، یووسف لە راستانە لە وتار و کردارا.

٣. شایەتەکەیش بەیانی ئەوەی کرد کە بوو بە هۆی پاکی یووسف علیه السلام.

٤. وەزیری میسر وتی: ﴿إنه من كيدكن، إن كيدكن عظيم﴾.

٥. ژنە میسرییەکان وتیان: ﴿ما علمنا عليه من سوء﴾.

٦. شەیتان بڕیاری داوە کە عیبادی خودا گومڕا بکا موخلیسەکان نەبێ و خودا فەرموویەتی: ﴿إنه من عبادنا المخلصين﴾.

٧. خودا فەرموویەتی: ﴿كذلك لنصرف عنه السوء والفحشاء﴾. واتە: بورهانمان پێ نیشان دا بۆ ئەوە کە خراپە لادەین لە یووسف، وەکوو سەرەتای خەیانەتەکە و خەیانەتەکەیش خۆی.

﴿وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٣٠﴾

واتە: هەرچەند خانەدانی وەزیر تێکۆشان بۆ کپکردنەوەی ئەو دەنگوباسە بەڵام بە یاسای «قسە کەوتە زارێ ئەکەوێتە شارێ» هەواڵ بڵاو بووەوە بە ناو شاری میسردا و ژنان کەوتنە وتوویژ و کۆمەڵێ ژنی هاوشان و هاوتەمەنی زلێخا وتیان: ژنەکەی عەزیز خەریکی دڵداری و هاتوچۆیە بۆ رامکردنی غوڵامە خزمەتکارەکەی خۆی و، بە راستی خۆشەویستی ئەو غوڵامە چووەتە ناو پەردەی دڵی زلێخاوە و بە راستی لەم رووەوە ئێمە زلێخا بە گومڕا و بێهۆش ئەزانین؛ چونکە خزمەتکارێ ئەوە نایەنێ.

﴿فَلَمَّا سَمِعَتۡ بِمَكۡرِهِنَّ أَرۡسَلَتۡ إِلَيۡهِنَّ وَأَعۡتَدَتۡ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا وَءَاتَتۡ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنۡهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيۡنَهُۥٓ أَكۡبَرۡنَهُۥ وَقَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّ وَقُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ٣١﴾

کاتێ کە زلێخا ئەم قسە و باسە پەنامەکی ئەوانەی بیست، وەلحاڵ قەسدی ئەوانیش لە ژێرەوە سووککردنی پایە و شانی زلێخا بوو، ناردی بە دوایانا بە ناوی دەعوەتەوە بانگی کردن بۆ ماڵی خۆی و، بۆ هەرکام لەوان نارنجێکی ئامادە کرد، جا کاتێ هاتن و دانیشتن هەر یەکە و نارنجەکە و چەقۆیەکی دا بە دەستەوە و، لەو کاتەدا کە خەریکی بڕینی نارنجەکە بوون زلێخا بە یووسفی وت: وەرە دەرەوە بۆ ناو کۆمەڵی بانگ کراوان! کاتێ چاویان بە شێوەی جوانی دلڕفێنی بێوێنەی یووسف کەوت زۆر بە شتێکی جوان و گەورە هاتە پێش چاویان و، بە هۆی تەماشاکردنی یووسفەوە هۆشیان لای خۆیان نەما و دەستی خۆیان لەت و پەت کرد و هەموو

وتیان: خودا دووره لە ناتەوانی و توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە بۆیە توانیویەتی ئەم ئادەمیزادە لەم شێوە فریشتە سروشتەدا دروست بکا، بەڵام ئەمە ئادەمی نییە و ئەمە فریشتەیەکی خاوەن قەدر و قیمەت و دیارییە.

﴿قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾

پاش ئەوە کە زلێخا حاڵی بوو ژنە میسرییەکانیش گیرۆدەی جوانی یووسف بوون و کەس بەرابەر بەو جوانییە خۆی ناگرێ، بێشاردنەوە وتی: ئا ئەم جوانە کە چاوتان پێی کەوت ئەو غولامەیە کە ئێوە سەرزەنشتی منی لەسەر ئەکەن! بە ڕاستی من هەوڵم دا بۆ رامکردنی بۆ خۆم و ئەو هەر خۆی نەداوە بە دەستەوە و خۆی گرتووە، وە پاش ئەوە کە ئێوە حاڵی بوون لەو شێوە و جوانییە و ئەزانن کە دڵ خۆی ناگرێ لە ئاستی خۆشەویستی ئەودا، سوێند ئەخۆم ئەگەر ئەوەی من لەوم ئەوێ نەیکا ئەخرێتە زیندانەوە و لە ریزی داماوەکانا ئەبێ.

لەمەوە دەردەکەوێ کە هەموو لایەکیان دانیان ناوە بەوەدا کە ئیختیاریان لە دەست دەرچووە بەرابەر بە یووسف. جا ژنەکانیش دەستیان کرد بە ئامۆژگاری یووسف و حاڵی کردنی لەوە کە لە موخالەفەی زلێخادا گیرۆدەی مەینەتی سزا و زیندان ئەبێ، وە یووسف کەوتە ئەمری واقیعەوە و لە پاش بیرکردنەوە لەوەدا کە نافەرمانی زلێخا سزایەکی مەحدوودە و نافەرمانی خودای تەعالا عارە بۆ دنیا و ئاگرە بۆ عالەمی نەبڕاوەی قیامەت، لە خودا پاڕایەوە و هەوڵی پاراستنی خۆی دا .

﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾﴾

وتی: پەروەردگارا! زیندان لە لای من گەلێ خۆشترە لەو کردەوە نابارەی کە ئەو ژنانە لێمیان دەوێ و، ئەگەر تۆ فرو فێڵی ئەم ژنانەم لێ لا نەدەی لەوانەیە کە مەیل بکەم بۆ رابواردن لەگەڵیانا و ئەو کاتە ئەچمە رزی ئارەزووبازانی نەفامەوە.

﴿ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ﴾

جا خودای تەعالا دوعاکەی لێ قەبووڵ کرد و وەزعێکی وای بردە دڵی وەزیری میسرەوە کە لەو خانەدانەی دوور بخەنەوە. وە بەم جۆرە یووسفی پاراست و فرو فێڵی ژنەکانی لێ لادا؛ چونکی بە راستی خودا دوعای موخلیسان ئەبیێ و زانایشە بە رازی دڵیان و ئەزانێ مەبەستیان چییە.

﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَـٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾ ﴾

پاش ماوەیەکی کەم لە کپ‌کردنەوەی ئەو رووداوە و پاش ئەوە کە چەن بەڵگەی مەعقوولیان دەست کەوت لەسەر پاکی یووسف و حاڵی بوون هەتا ئەو لەوماڵەدا بێ خەڵکی باسی خانەوادەکەی ئەکەن فیعلەن لە ماڵیشەوە هۆی کاری نابار هەر دەوام ئەکا. بۆیان دەرکەوت کە باش وایە ماوەیێ یووسف زیندانی بکەن تا ئەو خەتەرە لەو خانەوادەدا نەمێنێ.

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَعْصِرُ خَمْرًا ۖ وَقَالَ ٱلْـَٔاخَرُ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ ۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾

واتە: فیعلەن بە ئەمری وەزیر یووسفیان زیندانی کرد و بە رێکەوت دوو گەنج لە خزمەتکارانی پاشای میسر لەگەڵ یووسفدا زیندانی کران؛ یەکێکیان نانی بۆ پاشا دروست ئەکرد و ئەویشیان مەشرووباتی دروست ئەکرد، ئەم دوانە بە تاوانی ئەوە زیندانی کران کە ئەیانەوێ پادشا دەرمانخوارد بکەن.

وە بە هۆی بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی کارەساتی خانەدانی وەزیرەوە دەرکردنی فەرمان بە زیندانکردنی یووسف مەشهوور بوو کە ئەم غوڵامە ئینسانێکی بە حورمەت و دڵ و داوێن پاك و خاوەن نەفسێکی پاکە، وە فیعلەن ئاداب و هەستان و دانیشتنیشی وەها بوو، بەم هۆیەوە ئەو دوو خزمەتکاری پاشایە باوەڕیان پەیدا کرد بەوە کە یووسف ئینسانێکی پیرۆزە و بە یاسای ئەو رۆژە بۆ ئەوە ئەشێ کە داوای تەعبیری خەوی لێ بکرێ. وە لەو کاتەدا ئەو دوو گەنجە هەر یەکە و خەوێکیان دی و هاتن بۆ لای یووسف بۆ لێکدانەوەی خەوەکەیان و، یەکێکیان وتی: لە خەوما دیم ترێم ئەگوشی و ئەمکرد بە شەراب بۆ پاشا، ئەوی‌تریان وتی: منیش دیم لە خەوما کە نانم لەسەر سەرم داناوە و پەلەوەر دائەبارن بەسەرما و لەو نانە ئەخۆن، ئەمانەوێ ئاگادارمان بکەی لە تەفسیری ئەم دوو خەوە، بە راستی ئێمە تۆ بە ئینسانێکی وا ئەزانین کە لە کۆمەڵی چاکان و پیاوچاکانی.

﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٨﴾﴾

کاتێ حەزرەتی یووسف وتاری خزمەتکارەکانی بیست، وە خودا حاڵی کردبوو لەوە کە یەکێکیان رزگار ئەبێ لە زیندان و لە لای پاشادا قەدری ئەبێ، ویستی لەم هەلەدا خۆی دەربخا و ئاگاداریان بکا لەوە کە خۆی لە لای خودادا قەدری هەیە و رەهبەرە و خودا گەلێ شتی پەنامەکی پێ نیشان ئەدا وەکوو چۆن باقی رەهبەرەکان

خۆیان دەرئەخەن لە ئادەمیزاد، وە پێی فەرموون: من نەك هەر بۆ تەفسیری خەو بەڵکوو خودا زانستێکی رۆحی وەهای پێداوم کە هەر خواردەمەنییەك لە لایەنی مەئمووری زیندانەوە رەوانەئەکرێ بۆتان بیخۆن لە پێش ئەوەدا کە بگات بە ئێوە ئەزانم چ جۆرە خواردەمەنییەکە و سوودی هەیە بۆتان بیخۆن یا زیان، وە ئەم زانستە لە جوملەی ئەوانەیە کە خودای خۆم فێری کردووم، وە سیرِی ئەم بەش و بەهرەیشە ئەوەیە کە من تەرکی ئایینی قەومێکم کردووە کە ئیمانیان نییە بە خودای تەنیا، وە کوفری رۆژی قیامەت ئەکەن، واتە: وەکوو باوەڕیان بە زاتی خودا نییە باوەڕیشیان بەوە نییە کە ئینسان لە پاش مردن زیندوو ئەکرێتەوە و پرسیاری کردەوە و بیر و باوەڕی لێ ئەکرێ و ئەگا بە جەزای خۆی.

وە کەوتوومەتە شوێنی ئایینی باوك و باپیرەکانی خۆم کە یەعقووب و ئیسحاق و ئیبراهیمە، وە بۆ ئێمە رەوا نییە و نەبووە قەت کە شەریك و هاوڕێ بڕیار بدەین بۆ خودای تەعالا، وە ئێمە دامەزراوین لەسەر ئایینی خودا پەرستی بە تاق و تەنیا وە لەسەر رەهنومایی ئادەمیزاد بۆ دینی تەوحید و خودای تەنیا پەرستن، وە ئەم بارەی ئایینی تەوحیدە لە فەزل و کەرەمی خودایە لەسەر ئێمە کە وەحی ناردووە بە فریشتەدا بۆمان، وە لەسەر خەڵکیش کە ئێمەی کردووە بە رەهبەر و رەهنومایان، بەڵام زۆربەی ئادەمیزاد نازانن بەم بارەیە و سوپاسی ئەو خودایە ناکەن کە ئەم ئایینی تەوحیدەی بۆ ناردوون بۆیە قەبووڵی ناکەن.

جا لەم شوێنەدا حەزرەتی یووسف ﷺ بە ئاشکرا کەوتە بانگ‌کردنیان بۆ ئایینی تەوحید و فەرمووی:

﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴾ ٣٩

ئەی دوو هاوڕێی من لەم زیندانەدا، ئایا پەرستنی چەن خودایەکی بلاّوی بێ‌جەمعییەتی بێ‌شوعوور و هێز باشە بۆ ئینسان؟ یا پەرستیاری خودایێ کە تاق و تەنیایە و زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا و کەس ناتوانێ بەرابەری بکا؟

﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾

ئێوە عیبادەت ناکەن بۆ غەیری خودا بۆ چەن بتێکی بێ‌نرخی بێ‌حەقیقەتی وەها نەبێ کە خۆتان ناوتان ناون، ئێوە و باوك و باپیرەتان، وە خودا هیچ بورهان و بەلگەیەکی ڕووناکی لەسەر دانەناون.

﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾

حوکم و فەرمان بە بەندەیی هەر بۆ خودایە.

﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾

ئەو خودایە کە ئەمری کردووە کە عیبادەت نەکەن بۆ ئەو نەبێ وە ئەمەیە دینی ڕاستی حەقی دامەزراو لە کائیناتا بەلاّم زۆربەی ئادەمیزاد ئەمە نازانن.

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسْقِى رَبَّهُۥ خَمْرًا وَأَمَّا ٱلْءَاخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِن رَّأْسِهِۦ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ ٱلَّذِى فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ ﴿٤١﴾﴾

جا پاش بەیانی بیر و باوەڕ و ئایینی خۆی و ئامۆژگاری زیندانییەکان، ڕووی کردە تەعبیری خەوەکانیان و فەرمووی: ئەی دوو هاوڕێی زیندانم! یەکەمتان، واتە

ئەوەتان کە لە خەویا شەرابی دروست ئەکرد بۆ پاشاکەی لەمەوبەر، ئەڕواتەوە بۆ سەر کاری خۆی و شەراب دەرخواردی گەورەکەی ئەداتەوە، وە ئەوەی دووەمتان ئەوە حوکمی ئیعدامی ئەدرێ و هەڵئەواسرێ بە سێدارەدا و لە بەر ناهەمواری حوکمەکەی ناهێنرێتە خوارەوە هەتا پەلەوەر لە سەری ئەخوا، ئەو شتەی کە لێی ئەپرسن بڕایەوە، واتە ئەنجامی ئەم زیندانی کردنتانە لە تەعبیری خەوەکانتانا ئەمەیە.

﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا ٱذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ ذِكْرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِى ٱلسِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾﴾

وە یووسف فەرمووی بەویانە کە باوەڕی وابوو ڕزگارە لە زیندان: کاتێ ڕۆیشتیتە لای پاشا باسی منی لا بکە کە بە ستەم لەم زیندانەدا ڕاگیراوم، بەڵکوو بەزەیی پێما بێتەوە و ڕزگارم بکا، بەڵام تێکەڵبوون بە کاری خۆیەوە و شادمانی بە ڕزگار بوونی خۆی تێکەڵی دنیای کردەوە و پەیوەندی بە شەیتانەوە پەیدا کردەوە و شەیتان بوو بە هۆی ئەوەی باسی یووسف فەرامۆش بکا و لای پاشا باسی نەکا وەك هەر نەیدیبێ! وە مەشهوور وایە حەوت ساڵ مایەوە لەو شوێنەدا. وە حیکمەتی ئەوەیش ئەمە بوو ئەو باسە شەرمئاوەرە نەمێنێ و یووسفیش بگات بە پایە بە لای پاشاوە.

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَـٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَـٰتٍ ۖ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَـٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾﴾

بە خواستی خودا پاش ئەو ماوە پادشای میسر خەوی دی: کە ڕۆژ بووەوە فەرمووی: بە ڕاستی من لە خەودا حەوت گای زەلامی گۆشتن و قەڵەوم دی لە نەهرێکەوە هاتنە دەرەوە و حەوت گای لاوازیشم چاو پێکەوت ئەو حەوت گا

قەڵەوەیان ئەخوارد و قووتیان ئەدان، وە حەوت گوڵە گەنمی سەوزی جوانم دی و حەوت گوڵی وشکی زەرد کەوتن بەسەر گوڵە سەوزەکانا و دایان پۆشین، وە لەم خەوە زۆر سەرم سوڕماوە، ئەی کۆمەڵی مەجلیس و ئەهلی فامی بارەگا تەفسیری ئەم خەوەم بۆ بکەن ئەگەر ئێوە لەوانەن کە تەعبیری خەو ئەزانن.

﴿قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾

ئەوانیش لە وەڵاما وتیان: ئەم خەوانە لە خەوی پڕوپووچ ئەچن، وە ئێمە زانا نین بە تەعبیری خەوی وەها؛ چونکی حەقیقەتیان نییە.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ


جا ئەو کابرای زیندانییە کە یووسف تەعبیری خەوەکەی بۆ کرد و رزگاری بوو، یووسفی کەوتەوە بیر پاش ئەو ماوە زۆرە و وتی: من خەبەرتان ئەدەمێ بە تەئویلی ئەم خەوە، ئەمر بفەرموون رەوانەم بکەن بۆ لای یووسف؛ چونکی لەو رۆژەدا کەس بە بێ فەرمانی تایبەتی نەیئەتوانی بڕوا بۆ زیندان و زیندان ببینێ، جا پاشا فەرمانی دا کە بڕوا بۆ زیندان و رۆیشت بۆ لای یووسف و عەرزی کرد.

﴿يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ


ئەی یووسف !؟ ئەی ئینسانی خودا پێداوی زۆر راست لە وتارا ! خەبەرمان پێ بدە لە تەئویلی ئەم خەوەدا پاشا دیویەتی: کە حەوت گای لەڕ حەوت گای قەڵەویان خواردووە و، حەوت گوڵە گەنمی وشکی پووکاوە کەوتوون بەسەر حەوت گوڵە

گەنمی سەوزی جوانا، هیوام وایە بڕۆمەوە بۆ لای پاشا و وەزیرەکانی و باسەکەیان بۆ بگێڕمەوە هەتا بزانن کە تەعبیری خەوەکەی پاشا چییە.

﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾﴾

فەرمووی: حەوت ساڵ کشتوکاڵتان ئاسایی ئەبێ ئەوە کە لەو حەوت ساڵەدا ئەیدوورنەوە وازی لێ بێنن هەر لە ناو گوڵەکەیا بمێنێتەوە کەمێ نەبێ لەوەی کە پێویستان پێیەتی بۆ خواردن.

﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾﴾

پاش ئەو حەوت ساڵە، حەوتساڵی ناهەمواری قاتی دێنە پێشەوە هەموو ئەو رزقەی هەڵتان گرتووە و داتان ناوە بۆ ئەو ساڵە گرانیانە، ئەیانخۆن، واتە خەڵکەکە ئەوەی ئامادەیان کردووە بۆ خۆیان بۆ ساڵە گرانییەکان ئەیخۆن کەمێ نەبێ لەوەی پاراستووتانە بۆ تۆوی کشتوکاڵ یا بۆ کاتی قاتە ساڵ.

﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾﴾

پاش ئەم حەوت ساڵە گرانییەیش ساڵێکی زۆر باش دێتە پێشەوە لەو ساڵەدا باران لە ئاسمانەوە ئەڕژێنرێ بەسەر عالەما و زەوی و زار هەموو ئەژییێتەوە، وە لەو ساڵەدا میوە و سەوزی زۆر دەستکاری ئەکەن و خولاسەکەیان ئەگرن بۆ شەربەت و پێخۆر و بۆ خواردن و رابواردن.

جا کابرای فرستادە ئەم باسەی بردەوە بۆ لای پاشا و گێڕایەوە بۆ ئەو و بۆ پیاو ماقووڵانی بارەگا. وە پاشا بە دڵ ئەو تەعبیرەی پەسەند کرد و هەموو خەڵکەکە قسەکەیان بە ماقووڵ زانی. جا پاشا هاتەسەر ئەم فەرمانە کە خودا فەرموویەتی:

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِي بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّـٰتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴿٥٠﴾﴾

جا پاش ئەوە پاشا حاڵی بوو لە فام و هۆشیاری یووسف وتی: بڕۆن یووسفم بۆ بێنن با چاوم پێی بکەوێ و بزانم حەقیقەتی چییە، وە کاتێ فرستادەکە هات ئەمری پاشای پێگەیاند، حەزرەتی یووسفم لەبەر نەجابەت و شەرافەت و نوورانییەتی رۆحی و دامەزراوی لە پایەدا، پەلەی نەکرد بۆ ئەوە بڕواتە دەرەوە بۆ لای پادشا بەڵکوو رێزی خۆی راگرت بۆ ئەوە کە لە عالەمی بارەگای پاشا دەربکەوێ کە یووسف ئینسانێکی شەریف و داوێن پاکە و فەرمووی بە کابرا: بڕۆ عەرزی پادشا بکە ئەمر بکا ئەو ژنانە کە دەستی خۆیان لەت و پەت کرد لەگەڵ ژنی وەزیردا کۆیان بکاتەوە و لێیان بپرسێ: حاڵی ئەوان چۆن بووە و حاڵی منیش چۆن بووە، وە ئەو ژنانە لەسەر چ ئەساسێ بە منیان ئەوت: فەرمانی سەییدەکەی خۆت (کە ژنی وەزیرە) بەجێ بێنە؟ بە راستی خودا زانایە بە فێڵی ئەوان بەڵکوو دان بە پاکی من و ناپاکی خۆیاندا بنێن.

﴿قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ﴾

جا پاش ئەوە فرستادەکە رۆیشت بۆ لای پاشا و قسەکەی حەزرەتی یووسفی عەرز کرد. پادشا ناردی ژنەکانی هەموو لای خۆی حازر کرد و پێی وتن: مەقسەدتان چی بوو کە دەورەی یووسفتان دابوو و تێی پێچا بوون و بەچی گەیشتن لەگەڵیا؟ ئایا لە یووسفەوە ئەساسێ هەبوو بۆ ئەو هاورد و بردی ئێوە، یا لە ئێوەوە بوو؟ وە یووسف هاتە سەر مەبەستی ئێوە و بە قسەتان رازی بوو؟

﴿قُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ﴾

ئەوانیش وتیان: حاشا! ئێمە هیچ رەفتار و ئاسارێكی ناپەسەندمان لە یووسفەوە دەرك نەكردووە نە لە ئەووەڵەوە و نە لە ئاخرەوە. لەوێدا زلێخا هاتە قسە و وتی:

﴿قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٥١﴾﴾

ژنەكەی عەزیزی میسر هاتە وتار و وتی: ئێستە راستی دەركەوت و كاتی ئەوە هات كە بەیانی واقیع بكرێ: ئەم ژنانە پەیوەندییان بە قەزییەی یووسفەوە نەبووە من هەوڵم لەگەڵ داوە و دەورم داوە و ویستوومە سازی بكەم و بۆ ئارەزووی خۆمی بگونجێنم، وە بە راستی یووسف داوێن پاكە و لەو كەسانەیە كە راست وتار و راست كارە لەگەڵ خودای خۆی و لەگەڵ مەسلەك و لەگەڵ خانەدانا و بە هیچ جۆرێ داوێنەی ئەو گەردی نەگرتووە.

﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّى لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾﴾ ۞

جا یووسف ئەفەرموێت: من داوای ئەم تەحقیقەم لە پێشا كرد بۆ ئەوە كە عەزیز بزانێ من خەیانەتم نەكردووە لەگەڵ خانەوادەی ئەوا لە پەنامەكییەوە و خودای تەعالا فرو فێڵی خەیانەتكاران ناگەیەنێتە ئەنجام.

﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِىٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٣﴾﴾

وە من پاكانە بۆ نەفسی خۆم ناكەم بە راستی نەفسی ئینسان تەبیعەتی وایە فەرمان ئەدا بە هێز لەسەر كاری ناپەسەند مەگەر ئەوەندە خودا میهرەبانی بكا و ئینسان رزگار بكا لە فیتنە و فەسادێ، بە راستی خودای من تاوانبەخش و میهرەبانە لەسەر هەموو بەندەكانی و منیش یەكێكم لەوان.

**بزانن! لەم شوێنەدا چەن قسەیێ هەیە:**

یەکەم: ئەمە کە ژنە میسرییەکان بە زاهیر شتێکی ناباریان نەکرد لەگەڵ یووسفدا دەی بۆچی یووسف داوای ئەوە ئەکا پاشا بانگیان بکا و پرسیاریان لێ بکا و بۆچی نیسبەتی فێڵی لێدان؟

وەڵامەکەی ئەمەیە: ئەگەر ئەو ژنانە جانیبی حەقیان رابگرتایە ئەبوا ئەوەندە ئامۆژگاری زلێخایان بکردایە کە لەوەپاش واز لە یووسف بێنێ وە یا بیفرۆشێ بە کەسێکیتر و لەو ماڵەدا نەمێنێ بۆ دەوامی ئەو دەنگوباسە. هەروا یووسف دەرکی کرد لەو ژنانەوە کە ئەوانیش هەر ئەهلی ئارەزوون و لە ژێرەوە ئەیانویست بە نەوعە فێڵێ یووسف بخەڵەتێنن هەتا لە ناویانا هاتوچۆ بکا و تووشی تاوانباری بکەن.

وە غەیری ئەو ژنانەیش کەسیتر ئاگادار نەبوو بەسەر وەزعی زلێخا و یووسفدا هەتا پاشا ئیستیفادەی عیلمیان لێ بکا بە حەقیقەتی ئەو رووداوە.

دووهەم: مەشهوور ئەوە بوو کە ژنی عەزیز دەوری یووسفی داوە نەك ژنە میسرییەکان، دەی بۆچی پاشا ئەڵێ: ﴿إذ راودتن يوسف عن نفسه﴾؟

وەڵامی ئەمە ئەوەیە:

١. پاشا بە هۆی وەسائیلی خاریجییەوە ئاگادار بووە لەوە کە ئەو ژنانەیش ویستوویانە یووسف لەو خانەدانا بمێنێتەوە بۆ ئەوە کە لە پاشەڕۆژا ئەوانیش هاتوچۆیەکی لەگەڵدا بکەن.

٢. ویستوویەتی کە ئەوانە بە تاوانبار نیشان بدا هەتا ئەوانیش بۆ چاری دەردی خۆیان بە راستی وەزعەکە بەیان بکەن.

٣. لەبەر ئەوە پاشا دەرکی کرد مادام کە یووسف باسی ژنی وەزیری نەکردووە وە هەر داوای پرسیاری لەوان کرد پاشایش وتی: ئەمە بێحیکمەت نییە با منیش هەر بەو شێوە بکەومە پرسیارەوە.

٤. لەو رۆژەدا وەزعی حورمەتگرتنی خانەدان زۆر باو بووە لەبەر ئەوە راستەوخۆ ژنی وەزیریان خانەگومان نەکردووە هەتا بە تەبیعەتی حاڵ باسی ئەویش بێتە پێشەوە، وە حیکمەتی ئەوەیش کە یووسف باسی ژنی وەزیری نەکرد ئەوەبوو کە مافی خزمەتی زۆری هەبوو لەسەر یووسف ئەویش ویستی کە هەتا مەجالی ببێ ئازاری دڵی زلێخا نەدا بۆیە زلێخایش زۆر بە ئاشکرا هاتە وتار و یووسفی بەرێز گرت و پاکی ئەو و تاوانباری خۆی روون کردەوە.

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ﴾

جا کاتێ پاشا پاکی یووسفی لەلا دەرکەوت فەرمووی: برۆن یووسف بێنن بۆ لام هەتا بیکەم بە یاوەری تایبەتی خۆم ئەگەر دڵم بە تەواوی پەسەندی کرد.

﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤﴾

جا کاتێ یووسف بە حوزووری پاشا گەیشت و قسەی لەگەڵدا کرد بە هۆی شێوەی مولاقات و ریعایەتی ئەدەب و نەزاکەتی لە قسەکردندا و دەرکەوتنی زانست بە توانایی ئیدارەیا بە تەواوی دڵی پەیوەندی لەگەڵ پەیدا کرد و وتی: بە راستی بێخەم بە ئیتر تۆ لە لای ئێمەدا دامەزراوی و ئەمینی لە هەموو جۆرە ئازارێ و بە خاترجەمی بۆ خۆت بژی.

﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥﴾

جا کاتێ حەزرەتی یووسف حاڵی بوو کە پاشایش ئینسانێکی میهرەبان و پیاوانەیە و بە شوێنی ئینسانی باشا ئەگەرێ و ئەو کارانەیش کە تاوانبارییان لێ پەیدا ببێ بۆ ئەو دەست نادەن و لەم لایشەوە گەلی میسر زۆر پێویستیان بە رزق و ژیوار ئەبێ و خزمەتی ژیواری گەلیش خزمەتێکی زۆر گەورەیە، بە پاشای وت: بمکە بە خاوەنی

ئیدارەی واریداتی میسر و هەموو واریداتی وڵاتی میسر بدەرە دەستم، واتە بمکە بە وەزیری مالییە و دارایی ئیمرۆ، وە ئەویش قەبووڵی کرد و لەسەر ئەو پایە دامەزرا لە بارەگای پاشادا.

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٥٦﴾

خودای تەعالا ئەفەرموێت: ئا بەمجۆرە پلە بە پلە بە وەزعێکی تەبیعی وە لەسەر یاسایەکی عادەتی یووسفمان لە وڵاتی میسردا دامەزراند و بە ئارەزووی خۆی بە حوکمی وەزیفەکەی لە هەر شارێکدا خواستی ببوایە دائەنیشت ئەیتوانی لە کاتی کشتوکاڵدا، ناوچەی کشتوکاڵ هەڵبژێرێ بۆ دانیشتن و لە کاتی واریداتا لە پایتەخت دانیشێ بە ئارەزووی خۆی، وە لە راستیدا ئێمە ئەتوانین هەرکەس بمانەوێ بە رەحمەت و میهرەبانی خۆمان بیگرینەوە و قەت ئێمە پاداشی ئینسانی خاوەن بیری پاك و کردەوەی چاك زایە ناکەین.

﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ۝٥٧﴾

وە پایە و مایە بۆ دنیایە و دنیا ئەبڕێتەوە و جەزای ئینسان لە پاشەڕۆژی نەبڕاوەدا گەلێ گەلێ باشترە بۆ ئەو کەسانە کە ئیمانیان هێناوە بە خودای تاق و تەنیا و خۆیان پاراستووە لە کوفر و بیر و باوەڕی نابار وە لە رەفتاری فاحیشە و کردەوەی ناهەموار و لە خوو و رەوشتی ناشیرین.

﴿وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨﴾

وە بە قەزا و قەدەری خودای تەعالا قاتی و گرانی داکەوت لە وڵاتی میسر و شاما و عالەم کەوتە پەرێشانییەوە، وە حەزرەتی یووسف بە هۆی ئیدارەی بەرزی

خۆیەوە رزقی ئەو ولاَتانەی خستبووە دەستی خۆی، رزقی بە نرخی موناسیب ئەفرۆشت، وە لەو چەرخەدا براکانی یووسف بە فەرمانی باوکیان غەیری «بنیامین» هەموویان بە شێوەی کاروانی هاتن لە ولاَتی کەنعانەوە بۆ میسر بۆ رزق کڕین، وە لەبەر ئەوە لەو رۆژەدا یاسا وابوو هەرکەس رزقی بویستایێ ئەبوو خۆی بڕوا بۆ لای خاوەن کاری گەورە، هەموویان رۆیشتن بۆ بارەگا بۆ لای یووسف و یووسف براکانی خۆی هەموو ناسیەوە، بەلاَم ئەوان بە هیچ کلۆجێ یووسفیان نەناسی.

یەکەم: زەمانێ رابوردبوو کە جیا بوونەوە لە یووسف لە تەمەنی منداڵیدا و ئێستە گەورە بوو و پیاوێکی پیاوانە بوو لە بەینی سی‌و چلدا.

دووهەم: یووسف لە بارەگادا لەسەر ئیدارەدا تەمسیلی پاشای ئەکرد بە تایبەتی لەو کاتی گرانییەدا و چەن مەئموور بە دەوریا بوو دەست لەسەر کەمەر وە وەزعی وەها نەدەهات بە بیریانا بۆ یووسفێکی لە بیرا بەجێ‌ماوی مردوو یا دەرهاتووی سەرگەردان لە ناو ولاَتی میسرا.

سێهەم: ئەو برایانەیش ئەوەندە فەلەکزەدە و داماو و بێ‌نان و ئاو بووبوون لەوانە بوون کە برا و رەفیقی خۆیان نەناسن چە جای کەسێکی وەها کە چەن ساڵە نەیاندیوە.

﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾﴾

جا کاتێ کە باری قەتارەکەی بۆ رێکخستن بەو رزقە کە داوایان کردبوو حەزرەتی یووسف لێی پرسین؛ لە ولاَت و نەژادیان. ئەوانیش وتیان: ئێمە ئەولادی یەعقووبی، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی ئیبراهیمین و، لە خانەدانی دینین و، دوازدە برابووین یەکێکمان

